ناوی کتێب : خەزانی عەشق

ناوی نوسەر :تەها عومەر رەسوڵ

تایپ :کۆمپیوتەری جوانکار

وێنەی بەرگ :نەوزاد حسین

بەرگ و دیزاین : دارا عبدالرزاق

تیراژ :500

ژمارەی سپاردن : 328 ی ساڵی 2004

چاپ : چاپخانەی تیشك

# چەند گوڵێك لە خەزانی عەشق – دا

لــە مێــژە ( جــان كۆكتــۆ) و تویــەتی (( شــیعر پێویستی‌یەكە: خۆزگە دەمزانی بۆ؟!)، بەڵێ شیعر كــۆنترین ســەربردە و مێــژووی لەگــەڵ مــرۆڤ و مرۆڤایەتی‌دا هەیە, زیاتر لەهەر ژانێكی تری ئەدەب لە هەست و نەستی مرۆڤەوە نزیكە. مرۆڤ هەمیشە بـەر لەهـەر شـتێكی تـر بـە شـیعر گوزارشـتی لـە سروشت و دەوروبەری خۆی وسەرجەم خۆشیی و ناخۆشــییەكانی كــردووە, لەبــەر ئــەوەی شــیعر پرۆسەیەكی تاكە كەسی‌یە زۆرتر بۆتە ئاوێنەی دەرخەری ناخی پڕ لە ئاخ و دەرونی كەیلی دەرد و كەسەری مرۆڤ.

"خــەزانی عەشــق" یــش كــە كۆمــەڵێك هــەوڵ و هەنگاوی سەرەتایین بەرەو دنیا بێ سنوورەكەی شـیعر, بـەڵام ئـەوەی جێگـەی سـەرنجە تێكـڕای تێكستەكانی كاكە ( تەها عومەر) شیعری سۆزدارین و بە كێشی پەنجە نوسراون و سەروادارن, زیاتر بە یەك شێواز و هەناسە نووسراون, واتا تێكستەكان بە بەراورد لەگەڵ یەكتردا زۆر بێ جیاوازین, بـەڵام

هاوكات بەدەر نین لە هارمۆنیا و وێنەی شیعریی دانسقە, هەندێ جار لە چوار چێوەی خەیاڵێكی شاعیرانە و هەستێكی ڕۆمانسیانەدا توانیویەتی گوزارشت لە دنیا بینی خۆی بكات, بۆ نمونە لە دەقی" ئاوێتە بوون" دا مامەڵەیەكی شاعیرانەی جوانی لەگەڵ ووشە و دەستەواژەكاندا كردووە, بە تایبەت كاتێك كە دەڵێت:

چەن حۆشە خەمی چەند ساڵەم بە بینینی تۆ بە بادەم

ساتێ ژیان لەگەڵ تۆدا بە گەنجینەی دنیا نادەم.

دیارە كاك تەها دەیەوێت لەڕێی ئەو دێڕە شیعرەوە پێمان بڵێت هەموو گەنجینەی دنیا- پارە و سامان- ناتوانێت دەستەبەری ساتێك ئاسوودەیی ڕۆحییمان پێببەخشێت, وەك چۆن عەشق پێمان دەبەخشێت.

هەروەك پێشتر ئاماژەم پێ دا شیعرەكان بەگشتی لەیەك دەچن, بەهەندێ جیاوازی كەمەوە, جیاوازییەكەش زیاتر لە خاڵێكدا بەرجەستە بووە, ئەویش دوای خوێندنەوەی تەواوی شیعرەكان خوێنەر بەو ڕاستییە دەگات كە شاعیر

پرسەداری عەشقێكی ناكام و لە دەستچووە, هەروەك

**لە شیعرەکاندا ئەم گوزارشتانە دەخوێنینەوە: ( ئای چەند تەنیام, حەز دەکەم بگریم, خەمەکانم هێندە زۆرن, بیرت ئەکەم, بەس ئەم جارە بتبینمەوە, عاشقێکی دڵشکاو و گۆرانیەکانی بەسەر چووم...) بەلاّم لە لایەکی ترەوە تا ڕادەیەك پێچەوانەی ئەوە دەخوێنینەوە بۆ نموونە**

**)برۆ تازە دڵی من مرد, بیّ بار, برِۆ لیم گەڕیّ, تۆم لەناو دڵما کوشت و هتد ....).**

**لە هەندێك شوێنیشدا دەچینە بەردەم ئەو گومانەی کە عەشقێك بوونی هەبووە بەلاّم دواجار پارە و سامان ئەو عەشقەیان لە خشتە بردووە, هەروەك لە شیعری ( لیّم بوورە) دا دەڵێت:**

**پێم وا نەبوو ئەم عەشقەمان وا دوایی بیّ**
**هەروا ئاسان هەموو شتیّ کۆتایی بیّ**
**پارە و سامان تۆشی گۆڕی بە داخەوە**
**پەشیمانم لەم ئەوینەم لە ناخەوە**
**لیّم ببورە کە تۆم خۆش ویست دەستم دامان**
**پیرۆزت بیّ یاری تازەی خاوەن سامان**

**لە هەندیّ لە هۆنراوەکانیش دا جیّ پەنجەی شاعیری**

**پـایز ( محمـد عومـەر عوسمـان) بـە هۆنراوەکـانی ( تەها) وە هەست پێدەکرێت, ئەویش بەڵگەی ئەوەیـە کە خودی تەها حەقیقەتی شیعری لای حەمە عومەر دۆزیوەتـــەوە چـــێژی لێبینیـــوە و چـــۆتە ژێـــر کاریگەرییەوە, هەموو ئەو راستییانەش لـە شیعری ( غوربـەت) دا دەبینرێتـەوە کـە هـەر بـۆ محمـد عومـەر عوسمان نووسراوە.**

**مـن لـە کۆتاییـدا وێـڕای هانـدان و دەستخۆشـی, داواشـم ئەوەیـە لـە کاکـە تـەها کـە زیـاتر لـە ئێسـتا بخوێنێتـەوە و زۆرتـر خـۆی مانـدوو بکـات, چـونکە دواجـار تـەنها خوێندنـەوە و بـەدوادا چـوون دەبێتـە دابینکەری داهێنان و بەرەو پێش چوون.**

**سالح بێچار**
1/6/2004

## بۆ چونێك بۆ ئەم خەزانی عەشقە

تەها عومەر ڕەسولٚ....... لاوێكی هەست ناسكی ئەدەب دۆست و ڕۆشنبیر.... لە هەولٚی ئەوەدایە بوونی خۆی و جێ پەنجەی بە ئەدەبە بە بایەخەكەمانەوە دیار بێ.... سەلیقەی دەربڕینی ئەندێشە بە زمانی ڕەوان و بێ گرێ و كاری گەری ئەم دەربڕینە لەسەر هەست و نەستی خوێنەر یا گوێ گردا پێناسە دەدەنە نووسەرەكە ئیتر نووسینەكە یا بڵێین بەرهەمەكە شیعر بێ یا چیرۆك یا هەر بابەتێكی تری ئەدەبەكە...

ئیلهام و خۆشەویستی ئاوێتە بوونیان دەبنە عەشق .... عەشق ئەو هەستە پیرۆزەیە كە لە یەك كاتدا شا مەرگ بوونی خۆشی و شیرینی و شامەرگ بوونی تاڵی و ناسۆری و دەردو مەینەت سەرمایەیەتی..... ئەم عەشقە دیارە سەردەمانێك و بگرە تا ئێستاش بەرۆكی (تەها) یان گرتووە و بە ناخیا تا سەر ئێسقان شۆڕبونەتەوە... كاریگەری شامەرگی دووەم بە شیعرەكانیەوە دیارە... لە كۆتایی ( چەند وشەیەك دەبێت بوترێ) دا بە ئاشكرا دەڵێ ( زۆر بەی عاشقانی ئەم وولاّتە هەر دڵشكان و دابڕان بەشیانە. هەر بۆیەشە زۆربەی شیعر و چیرۆك و

**گۆرانیەکانمان بوونەتە هەڵگری خەم و ئەندێشە و فرمێسك).**

**مام تەها, بالاّی تۆ ئەم کالاّی خەم و ناسۆرە نەبڕیٚ بەسەر عاشقانی ئەم وولاّتەدا... لای هەموو مرۆڤێکی سەر ئەم گۆی زەوییە دەست داربیٚ یانەدار... ڕەش بیٚ یا سپی عەشق یەعنی کۆمەڵیٚ ژانی خۆشی ... کە دەڵێم خۆش ... ئەو ژانە نەبیٚ تامی شیرینی عەشق نامێنیٚ... ئەم هەست بەخەم و ژانە سیمایەکی دروستی بیٚ گەردی پاکی دنیای عەشق و ئەوینە... بۆ ڕاستی ئەم بۆ چوونە مرۆڤەکان زیاتر ئارەزوویان لەو بەرهەمانە هەیە کە ڕاستەوخۆ ئاشنان بە ژانەکانیان نەك خۆشیەکانیان... وەك دەرمان دەگەڕێن بۆی تا ئازارەکانیانی پیٚ بشکێنن... چیٚژی زۆر لەو ئازار شکێنانە دەبینین..**

**من سەرکەوتنی شیعرەکانی ناو ئەم ( خەزانی عەشق) ە بەوە دەزانم کە ڕاست گۆیانە هەستی بە ژانی عەشقی پێوە دیارە... بەلاّم هەندیٚ ووشەو دەربڕێن لەناو شیعرەکاندا وەك درەختێکی بەردار تاکو تەرا میوەی پیٚ نەگەیوی پێوە دیارە..ئەمەش لە وەوە هاتووە کە نووسەر خۆی زیاتر بە کێشی پەنجە و سەروادار بەستۆتەوە و لەیەك بۆ چوون و**

بۆتـەدا, دەخولێتـەوە ... مـن وای بـۆ دەچـم کـە ئـەم شیعری گۆرانیانە لای ( تەها) دەبیٚ وابیٚ و ( شیعری حـوڕ) ئـەو تامـە نـاوەن بـە گـویٚ گـر, نمونـەش بـۆ مەبەسـتی هـەردوکمان شـیعرەکانی د. فەرەیـدون ئەحمەد موحەمەد و کەسانی خاوەن هەڵبەستی لەو جـۆرەن. کـە زۆربـەی ئـەو بەرهەمانـە یـان کراونەتـە گۆرانی ... شیعری شاعیرانی تر هەن کە زۆر بەتام و چێژ تر و کاری گەرترن چونکە دوورن لەم ڕێچکەی کێشـی پەنجـە و سـەرواداره نـەکراون بـە گـۆرانی و ئاوازدانەر ناتوانیٚ مامەڵەیان لەگەڵ دا بکات...

لە کۆتایدا بەوە دڵم خۆشە کە سامانێکی بەنرخی وەك ( تـەها عومـەر) تـازە لـە کـوورەی شـیعری گۆرانیدایـە و شـتێکە کـە بـوونی خـۆی دەبێـت و خزمـەت بـە ئـەدەب و هونـەری گـۆرانی کـوردی دەکات... هیوای سەرکەوتنی زیاتری بۆ دەخوازم...

محەمەد رەحیم رەمەزان

( محەمەد نیروانی)

2004/6/6

## چەند ووشەیەك كە دەبێت بوترێن

نووسینی شیعر بەتایبەتیش شیعری گۆرانی كارێكی گرانە و پێویستی بە ئەزموون هەیە. ئەم شیعرانەی لێرەدا نووسراون تەنها چەند هەولێكن لەم بوارەدا و خۆتاقی كردنەوەیەكە لە بواری نووسینی شیعری گۆرانیدا و مەرجیش نییە هەموو شیعرەكان سەركەوتوو بن یان هەموویان مەرجی شیعری گۆرانییان تێدا بێت .

هەموو هەولێكی نوسینیش لە سەرەتاوە لە كەم و كوڕی بەدەر نییە و ڕەنگە نووسەرەكەی دوای چەند ساڵێك كە ئەزموونی نووسینی بەرفراوانتر دەبێ ئەو بەرهەمەی خۆی بە لاواز و ساكار بداتە قەڵەم بەلاّم بە بڕوای من ئەو بەرهەمە هەر چاپ كردن و بڵاو كردنەوەی باشترە وەك لە هەڵگرتن و نیشان نەدانی بە خوێنەران, چونكە هەر بەرهەمێك زادەی ئەزموونی تەمەنێكی نووسەرەكەیەتی و باشترین

شایەت حاڵی ئەو سات و دەمەیە.

ڕەنگە ئەم شیعرانە یان باشتر بڵێین ئەم هەوڵە شیعریانە کاریگەری زۆری شاعیرانی لیریکی وەکو بەڕێزان ئەحمەد محەمەد، فەرەیدون عەبدول بەرزنجی، ساڵح بێچار، محەمەدعومەر عوسمانی پێوە دیار بێ و بگرە هەندێ ووشەو تەعبیری تێدابێ لەهی ئەوان بچێت، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت وێنەو تەعبیر یان دەستەواژەی ئەو شاعیرانە نەقڵ کرابێتە ئەم شیعرانەوە, بەڵکو تەنها کاریگەرێتی‌یەو زۆر جار ( لا ئیرادی) یانە و بێ ئاگایانە بووە و دوا جار زانیومە ئەم دەستەواژە یە لای ئەو شاعیرەش هەیە....

هیوادارم بتوانم لە داهاتوودا لەو کاریگەرێتی یە ڕزگارم بێ یان هیچ نەبێ ئەو کاریگەرێتی‌یانە بەسەر شێوەکانی داهاتوومەوە کەم ببنەوە, بێ گومان هەر کەسێك شاعیر بێت یان نووسەر ناتوانێت بەدوور لە شیعر و نووسەرانی تر بەرهەمێك بنوسێ و کاریگەری هیچ کەسێکی بەسەرەوە نەبێت, گرنگ ئەوەیە بتوانێت کاریگەری‌یەکە زۆر نەبێت لەسەری و

داهێنـــان و جـــێ دەســـتی خـــۆی دیـــار بێـــت لەبەرهەمەکەیدا.

خاڵێکی تریش کە ئەمەوێت ئاماژەی پێ بدەم: ئەم شـــیعرانە هـــەروەك لـــە ناونیشـــانی کتێبەکـــەوە دەرئەکـــەون زۆربـــەیان شـــیعری خـــەماوی و چـــاو فرمێسکاوین یان باس لە دابڕان وشکستی عەشق ئەکـەن, ئەمـەش هـەر کاریگـەری دەوروبـەرە و لـە نیشـتمانێکی وێـران و هـەلا هـەلا کـراودا, لـە نـاو خەڵکانێکی ڕۆح بریندار و تەنیا و بە جێماو و بەش مەینەت دا هەر شیعری وادا لە دایك ئەبێت.

زۆربەی عاشقانی ئەم وولآتە هەر دڵشکان و دابڕان بەشـیانە. هەربۆیەشـە زۆربـەی شـیعر و چـیرۆك و گۆرانییـەکانمان بونەتە هـەڵگری خـەم و ئەندێشـە و فرمێسکی عاشقان.

طە عومەر رەسول
2/6/2004

# ئاوێتە بوون

کە ئەتبینم چی خەم هەیە لە دڵما ئەرەوێتەوە....
کە ئەدویێ بۆم کێوی مەینەت هەرەس دێنێ و
ئەتوێتەوە
ئای لەو نیگا سیحراویە چۆن منی خستە داوتەوە...
لەگەڵ هەر تەماشایەکا قەستمە بێمە ناو چاوتەوە...
ئای لەو خەندە خەمڕەوێنە لەو دەنگە ناسک و نەرمە
لەو ڕۆیینە پڕ نەشئەیە ئەو نازە تێکەڵ بە شەرمە
چەن خۆشە خەمی چەن ساڵەم بە بینینی تۆ بە بادەم
ساتێ ژیان لەگەڵ تۆدا بە گەنجینەی دنیا نادەم
چەند حۆشە گوێم لە دەنگت بێ و نیگام غەرقی
تەماشات بێ
هەناسەمان تێکەڵ یەک بێ با تەمەنیشم دوا سات بێ.

*******************
*ئەم شیعرە لە ئەدەب و هونەری ڕۆژنامەی کوردستانی نوێدا بڵاوکراوەتەوە.

# لێم ببورە

کە تۆم خۆش ویست هەموو شتێ لەلام جوان بوو
ئەوەی دڵم لێی بێ خەم بوو دابڕان بوو
پێم وانە بوو ئەم عەشقەمان وا دوایی بێ
هەروا ئاسان هەموو شتێ کۆتایی بێ
پارە و سامان تۆشی گۆڕی بە داخەوە
پەشیمانم لەم ئەوینەم لە ناخەوە
وام ئەزانی عەشقی ئێستاش وەک جارانە
وەفا و پەیمان سیفەتی ئەویندارانە
لێم ببوورە کە تۆم خۆش ویست دەستم دامان
پیرۆزت بێ یاری تازەی خاوەن سامان

*****************
*ئەم شیعرە لە ئەدەب و هونەری ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ دا بڵاوکراوەتەوە.

# حەزێکی وەریو

کە یەکەم جار خۆشم ویستی وامئەزانی زۆر ساکاری
بەڕووکەشت هەڵخەڵەتام نەمئەزانی وا بێ باری
نەمئەزانی هەروا بەئاسان لەسەر دوو پەت یاری ئەکەن
ئاوا خێرا دڵ ئەگۆڕی و سنوور بۆ من دیاری ئەکەی
حەز و خۆزگەمت ژێر پێ نا لەبەردەمما وەک مناڵێ
بەسەرزاری وتت نابێ کەچی دڵیشت وا ناڵێ ...
خۆشەویستیت لێ ئەباری سەرەتا تۆ ئاوا نەبووی...
تیری ئەوین پێکا بووتی و عاشقێکی پەروانە بووی
چی تۆی گۆڕی وا کت و پڕ کۆتایی بە عەشقە بێنی

**گوڵی ئەو حەزە ناکامە بە ڕقەوە بوەریێنی**

**بەلام ئاخ لەگەڵ هەستی خۆت خۆزگەیەک تۆز ڕاستگۆ ئەبووی**

**ووشەی دەم هەستی دڵ بوایە و دوور لە داوی درۆ ئەبووی**

**من ئەزانم ئێستەش دڵت هەر بۆ ئەو عەشقە لێ ئەدا**

**تیشک و نیگای خۆشەویستیت لە هەر کوێ بم لەوێ ئەدا**

**پێت وا نەبێ پەیوەندیمان وەک جارانی لێ بێتەوە**

**وەکو سێبەر دوات کەوم و حەزکەم نزیک بم لێتەوە**

**تازە نێوانمان دوایی هات پەشیمانیش دادت نادا**

**نامەوێ هەرگیز بتبینم چون ڕەنجی منت بە بادا**

# پەشیمانی

بڕوام بە عەشقت نەماوە بڕۆ چیدی ڕێ مەگرە پێم
گاڵتەم بە نیگاکانت دێ دە وازبێنە چیت ئەوێ لێم
هەرچییەک بیت سەیرت ناکەم هەرچەندە بڕازێیتەوە
جوانیت هەمووی ڕووکەشە لام وەک گوڵیش
بگەشێیتەوە
تازە دڵی من تۆراوە لە عەشق و لە خۆشەویستیت
پەشیمانم لە ئەوینت ئەوە نەبویت من ئەم ویستیت
چیت ئەوێ لێم بڕۆ دڵت بۆ یەکێ تر بکەرەوە...

# زریانی خەم

ژیانی من وا سەراپا بۆتە پارچەیەک لە ئازار
زریانی خەم ڕایماڵیوم چۆن بگەمەوە بە کەنار
دڵم تۆپەڵێک ئاگرە و هەموو جەستەم ئەسوتێنێ
غوربەت بۆتە پایزێک و گەڵای عومرم ئەوەرێنێ

## درەنگ هاتی

**کاتێ هاتیتە بەر چاوم خەمەکانم نوێ بوونەوە**
**هەرچی ڕق و کینەم هەبوو وەکو بەفری پار چوونەوە**
**چاوەکانت چەند خەماوی بۆ نیگای چاوم ئەگەڕان**
**ئەوەندە شپرزە دیاربووی تێکڕای هەستەکانم گۆڕان**
**چەن سەیر بوو بەلامەوە ئەو هەڵسوکەوتە نامۆیە**
**بەبێ دەنگی لام دانیشتی بۆ دیدار و گفت و گۆیە***

**نەم ئەزانی چیت پێ بڵێم چۆن ئەو تەلیسمە بشکێنم**
**دوای چەندین ساڵ تورەیی و رق چۆن گفتوگۆ دامەزرێنم**
**بیرتە هەستی منت چۆن کوشت, نەت هێشت یەکترمان**
**خۆش بوێ ؟**
**دڵی منت وا کرد بە بەرد توخنی هیچ کچێک نەکەوێ؟!**
**ئەوا ئێستاش بەبێ دەنگی لەبەردەمما ڕاوەستاوی**
**چاوەڕوانی قسەی منی شپرزەیت و پەشۆکاوی**
**برۆ تازە دڵی من مرد نە تۆ و نەکەسی خۆش ناوێ**
**خۆشەویستی بووبە دۆزەخ ئیتر ناکەومە هیچ داوێ**
***گفتوگۆیە : گفتوگۆیەک**

# ترسی عەشق

**نازانم چۆن بێمەوە لات, ئەو عەشقە زیندووکەمەوە**
**هەستی دڵ چۆن دەربڕم بۆت جارانت بیر بخەمەوە**
**لەگەڵ زەردە و نیگاکانتا هەستێ دڵم داگیر ئەکا**
**دڵم وەک مناڵێ ئەگری بەنیگای تۆ خۆی ژیر ئەکا**

زۆر ئەترسم ئەمجارەشیان نیگاکانت فێلاّوی بن
بزە و زەردە و تیشکی چاوت هیوایان تیا نەبێ بۆ من
ئەمجارە خۆم ئەپارێزم ناکەومە داوی ئەوینت
دوورە پەرێز خۆم ڕائەگرم نایەمە سەر بڕواو دینت
بڕۆ لێم گەڕێ من دڵم جێگەی عەشقی تیانەماوە
بۆ کەسێکی وا بگەڕێ کە بڕوای بە عەشقت ماوە

## بارانی عەشق

عەشقێک دڵی داگیر کردووم نازانم چۆن بیکەمە دەر
ئەو پەیمانەی بە خۆم داوە نازانم چۆن بیبەمە سەر
پەیمانم دابوو تاماوم قەت توخنی عەشق نەکەوم
کەچی ئێستا هەمان عەشق بۆتە خولیای ڕۆژ و شەوم

**دڵم هێندە نیگەرانە گەڕاومەتەوە بۆ جاران**

**ژیانیشم وشکە ساڵییە ئاواتە خوازم بۆ باران**

**خولیای بارانی عەشقێکم خەمەکانم بشواتەوە**

**ئازارەکانم ڕامالێ و کەمێ دڵم بداتەوە**

تەنیایی

ئای چەندە تەنیام کەسێک شک نابەم
مەینەتی و خەمم بیر بباتەوە
دڵێکی تەنیا و ڕۆحێکی ماندوو
کێ هەیە ئاورێ لە من باتەوە
***
حەز ئەکەم بگریم گریانێکی وا...
ئازارەکانم هێور کاتەوە
وەکو بارانێک بەخوڕ دابکا
خەمی چەن ساڵەم پاک بشواتەوە
***
کێ ئاگاداری ناڵەی ڕۆحێکە
شەو بە چ حاڵێ ڕۆژ ئەکاتەوە
لەشێکی ماندووی ژێر هەرەسی خەم
هیچ دەستێ نەهات ڕاستی کاتەوە

وانە زانی

**تۆ وات ئەزانی گەر منت نەویست**

**ئیتر عەشقی من ئەکوژێتەوە؟!**

**تەنها ناوی تۆم لەسەر زار ئەبێ و**

**هەرگیز یادی تۆم بیر ناچێتەوە؟!**

**تۆ وات ئەزانی گەر بەجێت هێشتم**

**ئیتر دڵی من قەت عاشق نابێ؟**

**لە باخی حەز و ئەویندارىدا**

**وەک بولبول شەیدای گوڵ و لق نابێ؟!**

**تۆ وات ئەزانی ئەگەر تۆ نەبی**

**باخی ئەوینی من بێ ئاو ئەبێ؟!**

**لە دنیای عەشق و خۆشەویستیدا**

**بە دوور لە سیحر و تیشکی چاو ئەبێ؟!**

**گیانە زۆر هەڵەیت گەر وابزانیت**

**دوای تۆ عەشقی من کۆتایی پێ دێ**

**لە تۆ بترازێ دڵ نادەم بە کەس**

**تا مردن بۆنی عەشقی تۆم لێ دێ**

**لە هەر ڕێیەکا کانیاوم تووش هات**

**تینوێتی خۆمی زوو لێ ئەشکێنم**

**مەرج بێ یەکەم کەس بەرەو پیرم هات**

**پەیمانی عەشقی لەگەڵ پێم بێنم**

# عەشق وانابێ

**تۆ چرای عەشقی دڵمت داگیرسان**
**گوڵی ئەوینت لە ناخما ڕووان**
**ئێستاکەش نە بات دیوە و نە باران**
**بۆچی ڕائەکەی لەو عەشقەی جاران**
**تیشکی چاوانت چۆن کوژایەوە ؟**
**وەڵامی دڵمت بۆ وا دایەوە ؟!**
**چی وای لە تۆکرد هەستت بگۆڕێ ؟**
**زمانت جۆرێکە و دڵیشت جۆرێ**
**هەر ڕۆژەی جۆرێ بیر ئەکەیتەوە**
**وەڵامی هەستم وا ئەدەیتەوە ؟!!**
**بێزار بووم لە دەست عەشقی شێتانەت**
**لە مەلی حەزی وێڵ و بێ لانەت**
**دڵی خۆت بدە بە یەکێکی تر**
**دەبڕۆ ڕێگام پێ مەگرە چیتر...**

# دڵی تۆراو

ئیتر لەمەودوا نیگای سیحراویت
هەرگیز چاوی من ناخەڵەتێنێ
بزەی سەر لێوو خەندەی ژەهراویت
دەرگای دڵی من ناترازێنێ
تۆ خۆشەویستیت لەناو دڵما کوشت
شەربەتی حەز و ئەوینمانت ڕشت
غرور ڕێی نەدای ئاشتم کەیتەوە
هەر بە دوو ووشە دڵم بەیتەوە
تازە دڵی من لە ژین تۆراوە
چون لە ئەوین و عەشقا دۆڕاوە

# وەرزی دابڕان

ئای چ غەریبستانێکە
ئەم دەڤەرە
چ ماملەکەتێکی نامۆو .....
پڕ لە رۆحی ماندوو و تەنیا و...
لێوان لێو ئەشک و کەسەرە
چ ویستگەیەکی سیخناخ لە..
خەم و قەهری ماڵئاوایی و..
جانتای ئامادەی سەفەرە
ئێرە مۆڵگەی وەراندنی گوڵی عەشق و ...
باڵ کردنی پەپولە بەریئەکانە..
جەنگەڵی تیرۆری عەشق و ...
لە بار چوونی خەونەکانە...
مرۆڤەکان چەندە ماندوو و ...
چەند دۆڕاون .....

گوڵەکان چەندە ژاکاوو ...

تینووی ئاون

عاشقەکان چەندە تەنیان...

چەند خەمبارن

ژوانگەکان چۆڵ و بێ دەنگ

گۆرانییەکان پرسەدارن

# ئاوێزان

**چەن خۆشە ئەگەر بۆ دواجاریش بێ**
**چاوم بە باڵات بکەوێتەوە....**
**نیگام تێر نیگای چاوی جوانت بێ**
**دڵ بە ڕوخسارت بگەشێتەوە**
**چەندم لا خۆشە جارێکی تر گوێم**
**تێربێ لە دەنگی ناسک و نەرمت**
**بۆنی قژی خاو, پەرچەمت بێ بۆم**
**لەگەڵ هالاوی هەناسەی گەرمت**
**دەمم بگاتە کوڵم و گەردن و ...**
**دوو نەرمایی گوێت**
**بە زمان بیماڵم گەردی ڕوومەتت...**
**وا نزیک بم لێت**
**هەناسەی سنگمان لەگەڵ یەکترا..**
**ئاوێتەی یەک بن**
**لە باوەشما بی گرنگ نییە لام..**
**ژیان و مردن...**

# بیرت ئەکەم

**چی بکەم بۆ ئەوەی تۆم بیر نەمێنیٚ**
**ناوت لە دڵما بکوژێتەوە**
**هەرچەن هەوڵ ئەدەم بۆم ناچێتە سەر**
**دڵم وێنەی تۆ قەدت ناسڕێتەوە**
**عەشقت لە دڵما زیاتر سەوز ئەبێ**
**شێوەت لە چاوما کاڵ نابێتەوە**
**یادگارییەکان چەندە ناخۆش بن**
**نەشئەن بۆ رۆحم پێی ئەژێتەوە**
**دەوەرە ساتیٚ گوێم لەدەنگت بیٚ**
**هەر بە تۆ دڵی من ئەکرێتەوە**
**لاپەڕەیەکی نویٚ هەڵدەینەوە**
**بازامی دڵم سارێژ بێتەوە**

# خولیای حەزێک

شەوانە هەرچەندن خەو لێم ئەتۆرێ
دەنگی تۆ دێت و دڵم ئەداتەوە..
شێوەت لە چاوما هەر دێت و دەچێ
کاتێک ئەزانم خەو ئەمباتەوە
بە ڕۆژ وەکو شێت هەر ئەخولێمەوە
هەموو جوانێکم لێ ئەبێ بە تۆ
ڕوخساریان شێوەی تۆیان گرتووە
لە دڵی تۆیا منیش وام ئاخۆ؟!
ئاخ بەس ئەمجارە بتبینمەوە
گوێم لە تریقە و نەغمەی دەنگت بێ
ئەوسا بشمرم گرنگ نی‌یە لام
چاوم ئاشنای باڵای شەنگت بێ

# سەرابی تەمەن

**خەم چەن بارێکی گرانە بەسەر دڵی تەنیامەوە**
**سیمام شپرزە و پەشێوو و ڕۆحیش بەو هەموو زامەوە**
**سەرابێ بوو تەمەنی من هەرواهات و بڕایەوە**
**هەرچی خەون و ئاواتم بوو وەکو مۆمێ توایەوە**
**نەخۆزگەیەکم هاتە دی نە ڕۆژێکم بوو بە شادی**
**لەم ژیانە مەرگە ساتە بەس گریانم بۆ مایەوە**

# عەشقی چی

**برۆ من و تۆ لێک دوورین هەرگیز بەیەک ناگەینەوە**
**هەروەکو دوو هێڵی تەریب هەرگیز لەیەک نادەینەوە**
**من هەر دڵێکی زامار و ڕۆحێکی هیلاک شک ئەبەم**
**دنیای تۆ نوقمی قاقایە و دنیای منیش پرسە و ماتەم**
**کوا دڵت بۆ عەشق ئەسووتێ سامانی تۆبەس جوانی‌یە.**
**نەبڕوات بە خۆشەویستی و نە بەگریانی دڵ نی‌یە**
**برۆ لێم دوربە من دڵم بەکەڵکی عەشقی تۆ نایە**
**ئەوینی من چرایەکە و جیهانی تۆش ڕەشە بایە**

# دڵی عاشق

**دەلێم گەڕێ تازە ڕێگەی دڵی من و تۆ لێک دوورە**
**جیهانی تۆ کوێرە ڕێیە و ڕێگای عەشقیش بێ سنورە**
**دڵی تۆ جێی عەشق نییە تۆ چووزانیت عەشق چۆنە..**
**قەت نازانیت دڵی عاشق ناسک وەک شووشەی بلوورە**
**کەسێ مانای عەشق ئەزانێ دڵی هیچ کەس نەڕەنجێنێ**
**ئاخۆ دەستی تۆ بە خوێنی دڵی چەندە عاشق سوورە؟!**
**دڵی عاشق هەروەک باڵی پەپوولە زووهەڵئەوەرێ**
**دە واز بێنە ڕێگەی عەشق لە ڕێگەی دڵی تۆ دوورە.**

# ڕوخسار و ناخ

چەن بە نازەوە ئەڕۆی بە ڕێدا
تریقە و قاقات دەنگ ئەداتەوە
گوایە عەشق پەی بە دڵت نابا
گرنگی نی‌یە قەت بە لاتەوە
بەقسە حساب بۆ هیچ کەس ناکەی..
گاڵتەت دێ بە عەشق بە خۆشەویستی
ئەوەی ووشەی عەشق بدا بە گوێتا
تۆ ئامادە نیت هەرگیز بیبیستی
بەلاًم لە ناخا کەسێکی تری
عەشق بە جارێ داگیری کردووی
کاتێ تەنیایی ڕۆحت ئەکرۆژێ
هەست ئەکەی بێ عەشق کەسێکی مردووی
بە ڕووکەش خەندە لەڕووت میوانە
بەلاًم لە چاوتا فرمێسک پەنهانە
کاتێک پێکەنین لە ڕوخسارتایە

دڵت قوڵپ ئەدا نوقمی گریانە

خەریکە گوڵی جوانیت ئەژاکیێ

بەهاری عومرت ڕوو لە خەزانە

ئەو عەشقەی دوێنیێ قەدریت نەزانی

تازە وا دڵت بۆی پەشیمانە

# کسپەی عەشق

چۆن دڵت هات بێ باکانە
ئەم عەشقە بەو دەردە بەری
زیادەیە
چەن پێ پەروا دێیت و دەچی
لە حاڵی دڵ بێ خەبەری
دڵی منت داگیر کردو
کەچی هەر زوو بەجێت هێشتم
چی تاڵاوی عەشق هەیە
هەمووت یەک بە یەک پێ چێشتم
من ئەزانم ئێستە دڵت ...
وەکو سیمات بێ باک نییە
لە ناوەوە ئەسووتێیت و
نازانیت پێکەنین چییە
بەس ڕوخساری درۆزنت ...

**ئەمانەی گشت شاردۆتەوە**

**لە لای من وا خۆت دەرئەخەی**

**عەشقی منت بیر چۆتەوە**

**من ئەزانم ئێستە شەوان**

**خەو بە منەوە ئەبینیت**

**بە ڕووکەشی پێ ئەکەنی و**

**لە ولاوە چاو بە ئەسرینیت**

**نیگای چاوت لە دوور دیارە**

**عەشقی من داگیری کردووی**

**سەیری سووتانی ناخت کە**

**چۆن ڕەنگ و ڕوخساری بردووی**

# غوربەت

-بۆ شاعیری غوربەت و تەنیایی محەمەد عومەر عوسمان -

ئەم شەو تەنیایی میوانە و خەمی لەگەڵ خۆی هێناوە
شادی بارگەی پێچایەوە و ئەشکی چاویش بە لێشاوە
یا دەوەری برینێکە وا ئەمشەو هاتۆتەوە سوێ
غوربەت چوار دەوری تەنیوم هانای دڵم بەرم بۆ کوێ
پەنا بۆ هەر شوێنێک ئەبەم هەر تاریکی و بێ دەنگی‌یە
دنیا هەمووی کش و ماتە لە هیچ لایە سروە نی‌یە
ئەمشەو تەنیایی ئەم کوژێ و هیچ کەسێکیش پێ نازانێ

ئەمرم پێش ئەوەی جێی بێڵم هیچ ئەدرەس و
ناونیشانیٚ
غوربەت سەری سپی کردم تەمەنیشم وەک گوڵ وەری
خەم تاکە هاوڕێی عومرمە و ماڵئاوای کرد بەختەوەری

## دڵێکی وێل

لە دەرگای دڵی من مەدە جیهانی من وێرانە یە...
خۆشەویستی بە جێی هێشتووم کوا هەواڵی لای من
هەیە
باخی دڵم زۆر لە مێژە گوڵی عەشقی تیا نە ڕواوە
چوار وەرزە گەلاٚ ڕێزانە و سەردەمانێکە بیٚ ئاوە
چاوەڕوانی خۆشەویستی لە من مەکە کچی چاوگەش
ئاسمانم بیٚ ئەستێرەیە و دنیای بەختم تا بڵێی ڕەش
خۆت دوور بگرە لە گێژاوی ئەم دڵە وێڵەو ناکامە
سەحرایەکی چۆڵ و هۆڵ و جیهانێکی زۆر بە سامە
خۆشی و شادی بەمیوانیش بەلای دڵی منانابەیە

خەم هاوڕێی هەمیشەییمە و فرمێسکیش تاکە سەرمایە
خۆشەویستی چیت ئەوێ لێم من باخێکی وشکەڵاتووم
عاشقێکی دڵشکاوو گۆرانی‌یەکی بەسەر چووم

## دیدەنی

ئۆخەی ئەم جارەش کە چاوم پێت کەوت
دڵەی شەیدام لە خۆشی‌یا سرەوت
ئۆخەی ئەمجارەش دیدەنیت کردم
خەمی چەن ساڵەی تەمەنت بردم
چەن خۆشە دواجار پێت شادبوومەوە
گەشی‌یەک کەوتە ڕەنگ و ڕوومەوە
لەسەحرای دڵما داتکردە باران
ژیانتەوە لام ئەو عەشقەی جاران
بیابانی دڵ بووبە ڕەهێڵە..
توخوا ئەمجارە بە جێم مەهێڵە

# سکالا

بۆ شاعیری پاییز محەمەد عومەر عوسمان

خەمەکانم هێندە زۆرن
دڵم لای کێ بکەمەوە؟
ئازارەکان بۆ کێ باسکەم؟
چۆن دڵخۆشی خۆم بەمەوە؟

***

ڕۆژ ژمێری تەمەن تێکرا
هەر خەمەو هەر ناخۆشیە
پەڕە پەڕەی هەڵدەیتەوە
هەمووی نوقمی ڕەش پۆشیە

***

ئەوا ئێستاش ڕەنگ و سیمام

بەرگی خەزنی پۆشیوە
گەلاَ ڕێزانی تەمەنمە و
چی خۆزگەمە هەڵوەریوە

## دەدەرکەوە

هەناسەکەم بۆ نەهاتی خۆ من چەندن ڕۆژە چاوەڕێم
وەکو تینوو بۆ قومێ ئاو بۆ بینینی تۆ چاو لە ڕێم
بەهارم بێ تۆ پایزە باخی عومرم گەلاَڕێزان
وا ئەمڕۆش بۆ ماڵی چۆڵم هەنگاوی غەریبی ئەنێم
دڵت لەئاستم چەن ڕەقە منت بە خەیالاَ نایە
جارێ نەمدی ڕووی خۆشی تۆ یان هەواڵێ بپرسی لێم
وا ئەمڕۆشم تێپەران و تۆ لە هیچ لایە دیار نەبووی
ئێوارەیەکی غەمگینە و ئەمشە و ڕۆژ نابێتەوە لێم
چاوم ڕوا لە ڕێگەتا سا بەڵکو دەرکەویتەوە
تا ئەو کاتەی دێیتەوە لام هۆنراوە بۆ بالاَت ئەڵێم
وا هەست ئەکەم شار چۆڵ بووە چونکە تۆ لەچاوم ونی
دە دەرکەوە فریشتەکەم نەکا وەک گوڵێک هەڵوەرێم

وەرەوە باباخی شیعرم لەنویٚ چرۆ دەرکاتەوە
تۆی کچی سیعرەکانی من تۆ لەکویٚ بیت منیش لەویٚم
بیٚتۆ پایزێکی زەردم پرسەی گەڵایە تەمەنم
بیٚتۆ مەلێکم لانەواز ، بیٚتۆ قەرەجێکی بیٚجێم .

## عەشقی تۆ

عەشقی تۆ خۆرێکە بەفری خەمی من ئەتوێنێتەوە
تۆ نازانی چیم بەسەردیٚ گەرساتیٚ دووربم لێتەوە
من غەریبی ڕۆحم ئەخوا گەرچاوم لەچاوت نەبیٚ
بەرێگایە کیشا نارۆم هەڵگری هەنگاوت نەبیٚ
گەر ڕۆژیٚ بالأت نەبینم وەکو ساڵیٚ لە من ئەڕوا
گوێم لەو دەنگە خۆشەت نەبیٚ ڕووباری شیعرم وشک ئەکا
شنەی لەنجەت لە دوورەوە ئارامی بۆ دڵم دیٚنیٚ
نەغمەی دەنگت مۆسیقایە ڕۆحی ماندووم ڕائەژێنیٚ
مانی من بەتۆوە بەندە تۆش ئاوڕیٚ نادەیتەوە
دڵم لای تۆ بەجێماوە دەرگای بۆ لیٚناکەیتەوە

## سوپاس و پێزانین

**سوپاس و خۆشەویستی و پێـزانینم بـۆ ئـەم بەڕێزانـە کـە هاوکاری یان کردم بۆ چاپ کردنی ئەم نامیلکەیە :**

-کاک دارا عەبدولڕەزاق

-کاک ساڵح بێچاری شاعیر

-شاعیر و چیرۆک نووس مامۆستا محەمەد ڕەحیم ڕەمەزان نیروانی

-شاعیر و نووسەر کاک نەوزاد ئەحمەد حسین

-کاک عوسمان عەلی فەتاح